

# وەچە خستەنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد لە ڕوانگەی شەرع و یاسا





نووسینی

یاساناس / بندی عمر عبداللّه

٢٠١٠

# وەچە خستەنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی
# ئادەمیزاد لە ڕوانگەی شەرع و یاسا

نووسینی : یاساناس / بندی عمر عبدالله

٢٠١٠

نرخی (٣٠٠٠) دینار

ناوی پەرتووك : وەچەخستەنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد لە ڕوانگەی شەرع و یاسا.

ناوی نووسەر : یاساناس / بندی عمر عبدالله

ئۆرەی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠١٠

بەرگ: کارزان سەعدی نووسینگەی مەریوان گرافیك

نەخشەسازی ناوەوە: نووسینگەی مەریوان گرافیك

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپ : چاپخانەی شەهاب – هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتیەکان ژمارە سپاردنی (٤٧٩) ساڵی ٢٠١٠ز پێدراوە

پێشکەشە بە :

## هەموو ئەم کەسانەی کە خولیای خویندن و خوێندنەوەیان هە یە .

فهرست

بسم اللة الرحمن الرحيم

## پێشەکی

الحمدلله رب العالمين الذى خلق الانسان من علق وعلمه مالم يعلم . والصلاة والسلام على سيدنا وحبيبنا محمد (صلىالله عليه وسلم) المبعوث رحمة للعالمين . وعلى أله وصحبه الطيبين الطاهر ين ومن دعا بدعوتهم الى يوم الدين . أمين

**مرۆڤ خوای گەورە بەشێوەیەك دروستی کردوە و بەدی هێناوە کە خاوەنی توانایەکی بە هێزی داپۆشراوە و بە دیار خستنی ئەو توانایە مرۆڤ دەتوانێ بگاتە ئاستێکی یەکجار بەرز داهێنانی تازە بەدەست بێنی .**

**بەهۆی بوونی گفتوگۆو پرسیاری زۆر لەلایەن رۆشنبیرو یاساناسان و کەسانی ئاینی لە بارەی ( وەچە خستنەوە لە رێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد ) بۆیە من وەك یاسا ناسێك ئەم بابەتەم گرتە ئەستۆی خۆم لەلایەنی شەرع و یاساییەوە لەبابەتی (وەچە خستنەوە لە رێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد ) دەستم بە گەرانی سەرجاوەکانی تایبەت بەم بابەتە کرد لەماوەی نزیکەی سێ مانگ بە گەلێك لایەنی ئاشنایەتیم پەیداکرد گەرچی تێرامان و وردبوونەوە لەتەواوی لایەنە شەرعی و یاساییەکانی بابەتی ناو براو زۆر لە مە زیاترهەلّ دەگرێت کە لە لێکۆلینەوەیەکی لەم شێوەیە دا بگەینە ئەنجامێکی بابەتی و تێرو تە سەل کەچی لە گەلّ هەموو ئەمانەش دەکرێت ئەم لێکۆ لینە وەش شوێنی شیاو بۆ خۆی بگرێت وە سوودێك بگەیەنێت . پرسیاری گرنگ لەم لێکۆلّینە وەیە ئەمەیە، ئایا وەچە خستنە وە لەرێگای کۆ پیکردنی ئادەمیزاد لە ڕووی شە رع و یاسا ییە وە رێگا**

پێدراوە یا خود ڕێگەی پێنە دراوە ؟ یا خود ئەم با بەتە لە ئە نجامی هۆکاری ئا بوری و پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا سەری هە لداوە ؟ لەمەش گرنگتر ئەمەیە هۆکاری وە چە خستنەوە چی یە ؟ ئە م گەلانە کێن کە سوودیان لێوەر گرتووە ؟ لەم لێکۆ لینەوە هەولّم داوە وەلامی هەموو ئەم پر سیارانە بدرێتە وە کە تایبە تن بەم بابەتەوە .

# دەستپێك

پزیشکەکانی هاوچەرخ ئەم زاراوانە بەکاردەهێنن بۆ نیشاندانی یەك چەمك، ئەویش ئەوەیە کە کۆپی کردن بریتی یە لە: سەرەوکاری کردن لە بارودۆخی جیناتەکان و رێکخستنی شێوەو دارشتە کیمیایی یەکەیان . جیاکردنەوەی جیناتەکان لە یەکتری وبەستنەوەیان (واتە بەستنەوەی توخمە بۆماوەیی خانەخوێ بەو جیاتانەی پێی بەخشراوە ) بەبەکارهێنانی رێگاکانی زانستی. بەواتایەکی تر بریتی یە لە پیتاندنی تۆو(پێکهاتوولە ٢٣کرۆمۆسۆم) بۆ دروستکردنی هێلکەیەکی پیتێنراو ی خاوەن ٤٦ کرۆمۆسۆم،پاشان دابەشکردنەوەی بۆ ئەوەیەکی نوێ لە دوو خانەوە،پاشان چوار خانە،وە بەم شێوەیە خانەکان چەندجارە دەبنەوە . زانستی سەردەم توانیویەتی هەر خانەیەك لە خوشکەخانەکەی جیابکاتەوە بە تواندنەوەی ئەو بەرگە پرۆتینیەشەکریەی کە دەوری ئەم خانانەی داوە ئەمەش بە بەکارهێنانی ئەنزیم و ماددە کیمیاییەکان هەروەها گەیشتە مادەیەکی نوێ لە قەوزەکانی دەریایی بۆ چاککردنەوەی دیواری خانە جیاکراوەکان، وە داپۆشینەوەیان بە شێوەیەك کە سودو کەڵکی خۆیان لەدەست نەدەن،وە دوای ئەم جیاکردنەوەیە کۆپی کردنی هەرخانەیەك بە جیا ئەنجام دەدرێت بەمەش ژمارەیەك جیناتی دوانەی لێکچومان دەست دەکەوێت،وە هەمویان دەچنەوە سەر دایك و باوکێکی دیاریکراو.وە ئەم رێگە نوێ یە لەلایەن هەردوو زانا ( ك . جیری هال ) و( روبرت ستلمان) دۆزرایەوە لە میانی کۆبونەوەی بەپیتکردنی ئەمریکی لە شاری مونتریال لە کەنەدا لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٢ مشتومرێکی گەورەی وروژاند،لەگەڵ ئەوەشدا خەڵاتی

باشترین توێژینەوەی پێدراکەواتە ئەم جۆرە بریتی یە لە کۆپیکردنی ناوەکی لە چوارچێوەی تۆماو،و هێلکۆکە، وە وەکو کۆپیکردنی پێشوو نیە کە تیایدا خانەیەکی تەواو وەردگیرا لە هەر بەشێك لە بەشەکانی مرۆڤ .

١- دەستکاری کردنی خانەکان بەو شێوەیەی کە کۆپی کردنی ئاسایی تیایدا ئەنجام دەدرێت لە وەرگرتنی خانەیەك،وە دانانی لەناو هێلکۆکەدا دوای کوشتنی ناوکەکەی،تەنها خودای بالآدەست ڕادەی ترسناکی و شوێنەوارە داتووەکانی لەسەر ئەوە کۆپیکراوەکان دەزانێت،ئەگەر تەنها دەستکاریکردن لەو پرۆتیناتەی کە دەدرێت بە مانگاکان شێتی مانگا و نەخۆشی تری لێ بکەوێتەوە،ئەبێ چی ڕوبدات لەو دەستکاریکردنەی لە ژێر خانی مۆڤدا دەکرێت .لە ڕاستیدا لەناوبردنی ئادەمیزادی تێدایە وە ترسناکترە لە بۆمبی ئەتۆمی،هەروەك پرۆفیسۆر (اکسل) ئەمەی ڕونکردۆتەوە کاتێك دەڵێت : ئەمە دەبێتە هۆی تێکدان و شێواندنی جیناتەکان،وە ئەبێتە هۆی بەدیهاتنی جۆرێك ئادەمی چاوەڕوان نەکراو کە جیاوازن لەو بونەوەرانەی هەن .

٢- ڕێگەیەکی نامۆو ناباوە لە زاوزێکردنی مرۆڤ،وە دەرچونێکی گاڵتەجاڕانەیە لە یاسای زۆربونی ئادەمی کە خودای باڵا دەست بەم یاسایە ڕێزی ناوە،ە مرۆڤ،وە بریتی یە لە گۆڕانکاری دروستکراوی خودای باڵا دەست و سونەتی خودا لە زیادکردنی مرۆڤایەتی .

٣- دەبێتە هۆی سەپاندنی باروودۆخێکی زاڵ بەسەر مرۆڤی تەرخانکراو لەڕوی شێوەو خود -ژات- کە نەتوانێت لێی لابدات .

٤- هەر خانەیەك تەمەنێکی گریمانەیی هەیە،ئایا خانە کۆپیکراوەکە ئەو تەمەنەی ماوە تەواوی دەکات، یان تەمەنێکی سەربەخۆی دەبێت .

٥- دەبێتە هۆی تێکدانی ئەو جۆرەی کە خودای باڵا دەست ویستی لەسەرە هەموو کەونی لەسەر بێت،لە میانیدا مرۆڤ کە نەخۆش و لەش ساغ

و بەهێزو بێ هێزی تیایدایەوە هەروەها جۆری جیاوازی تیایدایە لەرووی ڕەنگ و هیتر.

٦- لە کۆتاییدا کۆپیکردنی ئادەمی دەبێتە هۆی تێکدانی خێزان کە بنچینەیە بۆ کۆمەلگای مرۆڤایەتی،وە تێکدانە بۆ ناوی خێزان و پێکهاندتەکەی،چۆن خێزان پێکدەهێنرێت لە سایەی کۆپیکردندا ؟ خێزان چی‌یەوکێ باوکەو کێ دایکە؟ وە پەیوەندی خانەکە چی‌یە بە خاوەنەکەیەوە،ئایا خاوەنی خانەکە باوکەبۆ ئەو مرۆڤەی لەو خانەیە کۆپیکراوە یان برای جومکەیەتی ؟ وە ئایا دایەنەکەی دایکی یەتی یان خاوەنی هێلکۆکەکە لە حالەتی جیاوازبونیان ؟ وە کێ مەحرەمە وکێ نامەحرەم سەبارەت بە پیاو، وە میراتگرتن چۆن دەبێت ؟ وە کۆمەڵێك کێشەو گرفتی لەم جۆرە .

٧- دکتۆر جیری هیل . وە لە خوارەوە بەرامبەر هەندێکیان دەوەستین لەگەڵ ئەم کارانەی ئەنجامیانداوە.

١- زانای دکتۆر جیری هیل: سەرکەوتوو بوو لە کەرت کردنی کۆرپەلەیەك بۆ هەشت وە توانی دوانەیەکی بلوری لە یەك کۆرپەلە بەدیبهێنێت لە ئەصلی یەك هێلکۆکە،وە کردارەکە بە پیتاندنی هێلکۆکەکە بە دوو تۆوی پێکەوە ئەنجامدرا، ئەم هێکۆکەیە هەڵبژێردرا بەمەبستی پیتاندنی لە دەرەوەی لەش.

٢- زانای دکتۆر سیفیر نیو انتینوری: بەڕەگەز ئیتالی وپزیشکی نەخۆشیەکانی ئافرەتان وشارەزا لەبواری پیتاندن ناونیشانی ڕێکخەری رۆشەنبیری و زانستی بۆ زۆرێك لە پرۆژەکانی کۆپی کردنی نهێنی بۆخۆی داناوە، وە ناوبراو یەکێکە لە بەناوبانگترین پزیشکانی جیهان لە چارەسەر کردنی نەزۆکی،بیروڕاکانی سەبارەت بەکۆپیکردنی ئادەمی

بۆئەومەبەستانەی کە بە مرۆڤایەتی وەسفیان دەکات ڕوبەڕوی ڕەتکردنەوەو قەدەغەکردنیان بووەوە لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهان .

٣- بانا یوتس زاڤوسی زانا: بەڕەچەڵك قوبرصی یۆنانی وهەلگری ڕەگەزنامەی ئەمریکی مامۆستای فسیۆلۆجی زاوزێ کردن لە زانکۆی کنتاکی لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا،وە کلینیکێك –عیادە- یەك بۆ چارەسەرکردنی نەزۆکی بەڕێوە ئەبات لە لیکسنغتون.

٤- هەردوو زانا روبرت برجز و توماس کنج : توانیان یەکەم بۆق کۆپی بکەن لە خانەکانی سەرەمێکوتەیەك وە فەزڵی ئەنجامدانی یەکەم کرداری سەرکەوتوو بۆ کۆپی کردن لە ئاژەلان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم دوانە .

٥- زانا جون جوردان : ئەم زانایە توانی بە سەرکوتوویی کۆپیکردنی بۆق ئەنجام بدات بەلآم ئەم جارەیان لە خانەکانی بۆقێکی بەتەمەن تر .

٦- زانا باتریك ستبتووادوارد: لە دایك بوونی یەکەم منالی بلوری کچێك بوو بەناوی (لویزا) کۆرپەلەیەك بوو لە ڕێگەی پیتاندنی لەنێوان تۆماوی پیاوو هێلکۆکەی ژن لەناو بۆڕیدا .

٧- زانا ایان ویلموت :گەورەترین ڕێسای پتەوی هەندەسەی بۆماوەیی تێکشاند وە توانی مەڕی دوللی کۆپی بکات لە ڕێگەی خانەیەکی جەستەیی وەرگیراو لە گوانی دایکەمەڕێك وە ئەمە یەکەم مەڕ بوو لە مێژوودا کە تەنها لە دایکەوە بەدیبهێنرێت .

٨- زانای دکتۆر تتسو تاکید:کاری کرد بۆ بەدیهێنانی دوو گۆلکی هاوشێوە لە یەك کۆرپەلەوە دوای کەرتکردنی وپاشان دوبارە چاندنەوەی لە گۆلکداندا، وە تتسو بە سەرپەرشتی کردنی بۆ تیمێکی توێژینەوە لە زانکۆی ولایەتێی ئەمرکی توانی سەرکەوتنی هونەری کەرت کردنی جیناتەکان لە مانگادا دوپات بکاتەوە .

٩- خانمە زانا بریجیب بواسولیە:بەڕەگەز فەرەنسی، بەڕێوەبەری زانستی کۆمپانیای کلونید کە بارەگاکەی لە (لاس فیغاس)ە،مامۆستای کیمیا لە زانکۆی نیۆرك،سەرپەرشتی تیمێك لە پزیشکان دەکات کاردەکەن لەسەر کۆپیکردنی منالێك لە جێگایەکی نادیار .

١٠- خانمە دکتۆر بیاتریس منتز: لە لە دەزگای توێژینەوەکانی شێرپەنجە لە فیلادفیا گەیشتە دوو ڕێگە کە نزیکن لە کۆپیکردن،یەکەمیان ئەو کۆپیەیەی لە لێکهەڵوەشانی جیناتەکان دروست دەبێت،وە دوەمیان بەیەکەوەبەستنی جیناتەکان ودروستکردنی بونەوەرانێك هەردوو دایك وباوکیان هەبێت لەجیاتی یەك (دایك یان باوك)، وە ڕێگەی یەکەم ئێستا زانراوە کە بریتی یە لە هەمان ئەو ڕێگەیەی ستیلمان و هول بلاَویکردەوە لەسەر جیناتی ئادەمی ساڵی ١٩٩٣، بەلاَم درێژەی ڕێگەی دووەم واتە پێکەوە نوساندنی جەنینی ناوبراو پێی گەیشست لە میانی توێژینەوەکەی لەبارەی ناوەندە بەسودەکانی بایەلۆجی بۆ دراسەکردنی جیاکردنەوەی خانەیی و دروستکردنی خانەکانی جەنینی،(منتز) کۆرپەلەیەکی وەرگرت کە لەئەنجامی پیتاندنی سروشتی نێوان دوو مشکی ساف سپی بەدیهاتبوو وە داینا لەناو بۆریەیەکی تاقیکاری لەگەڵ کۆرپەلەیەکی تر کە لەئەنجامی پیتاندنی سروشتی نێوان دوو مشکی ساف ڕەش بەدیهاتبوو،پاشان هەندێك گیراوەی کیمایی خستە ناو بۆری تاقیکاریەکە بۆ تواندنەوەی ئەو مادەیەی کە خانەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە،بەمەش خاەکان لێك هەڵوەشان و تێکەلاَو بوون،وە پاش کەمێك یەکیان گرتەوە بەبێ ڕەچاوکردنی پێکەوەبەستانی پێشوویان،وە لەکۆتایدا ئەم خانانە کۆرپەلەیەکیان دروست کرد .وە لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە ئەگەر وەچە خستنەوە سەرکەوتوو بوبێ لەم دواییانەدا لە ئاژەلان و پیشتریش لە ڕوەکدا ئایا دەتوانرێت سەرکەوتوو بێت لە داهاتوویەکی نزیك یان دوور سەبارەت بە مرۆڤ

؟ئەوچاپەی کە هەواڵی لەدایك بوونی دوللی بلآوکردەوە لە سەروتاریدا دەڵێت : لەمرۆ بەدواوە دەتوانرێت کۆپیکردنی ئادەمیزادلە خانە پێگەیشتوەکان ئەنجام بدرێت لە هەرکاتێ لە ماوەی ساڵێك تاوەکو دەساڵ، وە زانای بایەلۆجی ئەمریکی دبلین کوری دەڵێت: لە ڕوی بنەماوە هیچ ناستەنگی یەك بەدی ناکرێت لە بەکارهێنانی خانەکانی ئادەمی لە کارگەو گۆڕینیان بۆ خانەکانی مرۆڤەوە هەموو ئەوەی پێویستمان پێیەتی وەرگرتنی چڵێکە لەخانەکانی زاوزێ کردنی ئادەمی ورێگری کردنی زۆربوونی، بەلآم کولن استیوارت زانای پەیمانگای شێرپەنچەی نەتەوەیی ئەمریکی دەڵێت لە حاڵتی جیناتەکانی مەڕ لە جیناتانەی کە هەن لەو خانەیەی تەرخانکراوە ناگۆڕێن هەتا هێلکۆکە سێ جار یان چوارجار دابەش ئەبێت بەلآم لە مرۆڤدا ئەو جیناتانە تەنها دوای دووجار دابەش بوون دەگۆڕێن،وە لەوانەیە ئەم جیاوازیەش ئەو کۆسپە کە نابڕدرێت لە کرداری کۆپیکردنی ئادەمیزاد، بەلآم پرسیاری گران ئەوەیە کۆپیکردنی ئادەمیزاد چۆن دەبێت لە داهاتوودا ؟ زانایان دەڵێن کۆپیکراوەکەی ئادەمیزاد لەوانەیە لە ڕواڵەتی هونەریەوە بەو تاکە بچێت کە خانەکەی لێ وەرگیراوە بەلآم ئەم کۆپیکراوە بەشێوەیەکی زۆر جیاواز دەبێت لەو نیشانانەی کە کەسایەتی پێ جیادەکرێتەوە لەڕوی بەهرەو زیرەکی: وە (جروس کاجان) زانای دەروونناسی لە زانکۆی هارفارد دەڵێت : ناتوانیت بگەیت بە وێنەیەکی تەواو لێکچوو وەك ئەوەی لەگەڵ دوللی بەدیهات .

# سەرەباسی یەکەم

## چەمکی کۆپیکردنی ئادەمیزاد و دیارترین ئامادەکاری بۆی

## بەشی یەکەم

### سەرەتای دروستبوون لە تایبەتمەندیەکانی قودرەتی خودا

ژیان خۆی دەبینێتەوە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر لە ڕێگەی هاوسەرگیری نێوان ژن و پیاو لەگەڵ ئەوەی ژیان ڕێگای جۆربەجۆری بۆخۆی داهێناوە بەلام هەر دروستکراوێکی نوێ لە منالێکی ساواوە بۆ ژوشکێکی دەریاسەرەتا لە یەك خانەوە دەستی پێکردوە .وەچە خستنەوەی نوێ کە بۆ مەڕی دوللی ئەنجامدرا وە ویسترا مرۆڤیش کۆپی بکاتەوە پشت دەبەستێت بە خانە ناجنسیەکان وە پشت نابستێت بە ڕێگە سروشتی زاوزێ کردنی گیانداران،بەڵکو پشت دەبەستێت بە وەرگرتنی خانەیەکی تەواو لە ئاژەڵکە پاشان لەدایك بوونی ئاژەڵێك لە هەمان ڕەگەز وهەمان جۆر،زانای بواری کشتوکاڵ (هوبرتوبیر )بۆ یەکەم جار زاراوەی (CLNING) بەکارهێنا ساڵی ۱۹۰۳ لەو کۆمەڵەی پێکهاتووە لە زیادکردنی تاکی پێشکەوتوو،پاشان بەکارهێنرا بەواتای کۆپیکردنی ڕوەکی لە یەك خانەوە چ ئاسایی یان ئەندازەکردنی بۆماوەیی،ئەمەش دەکەوێتە ژێر هونەری چاندنی خانەو شانەکانی ڕوەکی،بەشێوەیەك زاناکان توانیان جۆری ڕوەکی نوێ بەهەم بهێنن پاشان چەمکی کۆپیکردن بەرەو پێشچوو تا بەکار هێنرا بۆ کۆپیکردنی جینی توخمە بۆماوەییەکان لە چوارچێوەی خانەکانی ڕوەکی وئاژەڵی .وە ئەم پێشکەوتنە لەرێگەی پێشکەوتنی زانستی بایەلۆجی یەوە هات،کە ناونراوە بە شۆڕشی گەورەی بایەلۆجی وە کۆپیکردن یەکێك بوولە

گرینگترینی بەشەکانیەوە یەکێك بوو لە بوارە بنەڕەتیەکانی هەندەسەی بۆماوەیی کە تواناکانی بۆماوەیی بونەوەرە زیندوەکان کۆنترۆل دەکات .وە یەکەم محاوەلە بۆ کۆپیکردنی ئاژەلی هەردوو زانای بەریتانی (روبرت بریجز، وتوماس کینج) پێی هەستان لە سالی ۱۹۵۲ کە توانیان خانەیەکی جینی بچێنن بۆ بۆقێك لە قۆناغی (البلاستولا) لە هێلکۆکەیەکی نەپیتێنراو دوای ئەوەی ناوکەکەی لێ دەرهێنرابوو .وە هەندێ کۆپیکردن دەبەستنەوە بە منالانی بلوری وە تێکەلاویەك لەم بارەیەوە ڕووی داوە،دکتۆر خالد الهضيبي مامۆستای نەخۆشیەکانی ئافرەتان ومندال بوون ڕونی دەکاتەوەو دەلێت :جیاوازی هەیە لە نێوان منالانی کوپیکراو لەگەل منالانی بلوری بەوەی کە لە منالانی بلوری هێلکۆکە لە دایکە و تۆویش لە باوکە وە ژنەکە لەسەرینی هاوسەرێتی پیاوەکەیدایە وە بەسەری زندویەتی یە،وە لایەنی سێیەم نی یە لەم کردارەدا ئەوەش بەتەواوی جیاوازە لە کرداری کۆپی کردن ونەو وەچە خستەوەی لە پێشەوە باسمان کرد.

# بەشی دووەم

## پێناسەی زمانەوانی وەچە خستنەوە(کۆپیکردن)

کۆپیکردن بەمانای داواکاری لەبەرگرتنەوە دێت،وە لەبەرگرتنەوە واتە گۆڕین و دروستکردنەوەی شتێك لە شتێك کە ئەمەی پێشو نی یە،وە گواستنەوەی شتێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، وە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر کۆپیکردن لە زمانەوانیدا چاوگە بەواتای کارکردن وە وشەی کۆپیکردن دانراوە لە بەرامبەر ووشەی (CLNING) ی ئینگلیزی ئەمەش وەرگێڕانێکی ناتەواوە چونکە ئەصلی ئەم ووشەیە (KLON) بەیۆنانی وە بەواتای گۆپکە یان چوزی ساوا دێت وە وشەی (CLON) ئینگلیزی بەرامبەرەکەی لە فەرهەنگەکاندا (نسيلة ) ە کە بە واتای دروستکردنی خانەکانو شانەکان و ئەندامەکان یان کۆرپەلەکان لە یەك خانەی پێشووبەلاٌم ووشەی کۆپیکردن بەرامبەرەکەی بەئینگلیزی ووشەی (KLON) ە لەبەر ئەوە ئێمە لەگەڵ ئەو کەسانە نین کە ووشەی کۆپیکردن بەکاردێنن بەڵکو لەگەڵ ئەوانەین کە دەڵێن وەچە نانەوە یان وەچەخستنەوە چونکە ئەمە لە تێڕوانینی ئێمەدا وەرگێڕانێکی دروستە، بەلاٌم لێرە بەدوا لەم توێژینەوەیەدا هەردوو زاراوەکە بەکاردەهێنم بەشێوەیەك کۆپیکردن بەکاردەهێنم کاتێك دەقێك دەگوازمەوە لە یەکێك لە توێژەران کە ووشەی کۆپیکردنی لەخۆی گرتوە، وە ووشەی وەچەخستنەوە بەکاردەهێنم کاتێك باسی بۆچونێك دەکەم.

**(نسل) وەچە : منداڵ لەبەر وەچەخستەوەی یەك لە دوای یەك، وە النسلان : ڕۆیشتن .گورگ ئەگەر ئازار درا تورە دەبێت و پەلامار دەدات، وە پیادەکە خێرا دەڕوات، وە نسل :شیکردنەوە، شیکردنەوەی خوری و موو و پەڕ، وە نسل : ڕوتانەوە، بەواتای هەڵوەرین و تەك هاتنەوە،پەڕی باڵندەکە ڕوتایەوە،ووشترەکە توکەکەی هەڵوەری .**

## کۆپیکردن( وەچەخستەوە) لەرووی زاراوەوە

دکتۆر احمد رجانی الجندی لە خستنە رووی ئەو توێژینەوانەی پیشکەش کراون بۆ کۆمەڵەی جیهانی فیقهی ئیسلامی پێناسەی کۆپیکردن پوخت دەکاتەوە بۆمان رونی کردۆتەوە کە هەموو پزیشکەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە بریتی یە لە گواستنەوەی ناوکە خانەی پیتێنراو -کە ٤٦کۆمۆسۆمی لەخۆی گرتووە -بۆ شوێنی ناوکی هێلکۆکە - کە ٢٣ کۆمۆسۆمی لەخۆی گرتووە- بەڵام جێ بە جێ کردنی ئەم کارە زۆرزۆر گرانە وە پێویستی بە تەقەنیاتی پێشکەوتوو و زانیاری زۆر هەیە،وە تنسیل (استنساخ) -کۆپیکردن - زاراوەیەکە لە ووشەی (نسیلة) وەرگیراوە کە بریتی یە لە بونەورێکی تەواو متابقی ئەویتر، وە(التنسیل) -وەچە خستنەوە - واتاکەی دروستکردنی بونەورێکی تەواو متابقی بونەورێکی ترە،وە بەکارهێنانی زاراوەی (استنساخ -کۆپیکردن - لە دەزگاکانی راگەیاندن لەم دواییانەدا بوەتە شتێکی باو بۆ کردارەکانی وەچە خستنەوە، وە دەتوانرێت شیردەرەکان کۆپی بکرێن بە دوو رێگە ئەوانیش : وەچە خستنەوە بەهۆی جیاکردنەوەی خوێنپارە -کۆرپەلە تا تەمەنی دوومانگ لەناو سکی دایکدا - وە وەچە خستنەوە بەهۆی چاندنی ناوك، وەچە خستنەوە بەهۆی جیاکردنەوەی خوێنپارە هاوشێوەی رێگەی سروشتی یە لە دروست بوونی دوانە -جومکە- ی وەك یەك.وە یەکێك لە هۆکارەکانی دروستبوونی دوانە -جومکە- ی وەك یەکبێهێزی ئەو پشتێنە رونەی دەوری هێلکۆکەی پیتێنراوی داوە،هەردوو خانەکە گەشە دەکەن بۆ پێکهێنانی دوو کۆرپەلەی وەك یەك، وە کرداری وەچە خستنەوە بەهۆی جیاکردنەوەی

خوێنپارە دەست پێ دەکات بە پیتاندنی سروشتی هێلکۆکە بە تۆو پاشان واز لێهێنانی هێلکۆکە پیتێنراوەکە بۆ ئەوەی بە سروشتی گەشە بکات لە ڕێگەی دابەشبونەکانی خانەیی تا دەبێتە خوێنپارەیەکی پێکهاتوو لە دوو خانە یان چوارخانە . وە وەچەخستنەوە بەهۆی چاندنی ناوك لە ڕێگەی سود وەرگرتن لەوەی کە ناسراوە بە هوەنرو پسپۆڕی چاندنی ناوك،ناوك ژوورێکی بچوکی ناو خانەیە وگۆکای چەشنی هێلەکانە،کە جیناتە بۆماوەییەکان لە خۆی دەگرێت، وە ئەم جیناتە بۆماوەییانە سەروکاری سیفاتەکانی شێوەیی و فەرمانی تاك وخانەکانی ڕێك دەخەن .

وە من پشتگیری ئەو بۆچونە دەکەم دەربارەی کرداری وەچە خستنەوە چونکە بە باەڕی من بۆچونێکی دروستە، وە شێخ عرفان سلیم توانیویەتی هەموو لەیەنەکانی زانستی و تیۆری کرداری وەچەخستنەوە -کۆپی کردن — ڕون بکاتەوە .

# سەرەباسی دووەم

## هەڵوێستی شەرع لەبارەی وەچەخستنەوە -کۆپی کردنی ئادەمیزاد

## بەشی یەکەم

### لەباسی چەند نمونەیەك لەو ڕێگاو شێوازانەی ڕێپێدراون لەشەرعدا کە لەمانەی خوارەوەدا کورتیان دەکەینەوە :

١- باشکرنی پسپۆڕیەکانی لەدایك بون بۆ دۆزینەوەی نەخۆشیە ترسناکەکان و ناسینەوەی جیناتەکانی نەخۆشیە ترسناکەکان.

٢- ناسینەوەی جیناتەکانی هەندێك نەخۆشیە بۆماوەییەکان وەك نەخۆشی شەکرەو کەم بینی وهەندێك جۆری شێرپەنجە بۆ چارەسەرکردنیان لەڕێگەی دروستکردنی مادەی (الانتفيرونات) ئادەمی لە سەرەتای ژیانیدا، وە زاڵ بوون بەهۆی ئەم مادەیە بەسەر ئەو ڤایرۆسانەی دەینە هۆی ئەم نەخۆشیانەی باسکران .

٣- زانینی ناتەواویەکانی جەستەیی و فزیۆلۆجی کە لە دوایدا توشی منالکە دەبێت بۆ لەدایك بوونی منالآنی تەواو دوور لە کەموکوڕیو تێکچوونەکانی جەستەیی .

٤- سەروکاریکردن لە سیفاتەکانی کۆرپەلە یان ڕەگەزەکەی لە نێوان کوڕ و کچ بەمەرجێك بەدووربێت لە تێکچوونەکانی جەستەیی .

٥- کۆپیکردنی دەزگاکان و ئەندامەکانی ئادەمیزاد بەمەبەستی گواستنەوەیان بۆ ئەوکەسەی پێویستی پێیەتی لە ڕێگەی بۆڕیەکان و

ئامێرەکانی تاقیکاری هەروەك لە زانستی پزیشکی نەشتەرگەری نەژادی ناسراوە.

٦- بەدەست هێنانی پێکهاتەیەك لە جیناتی ئادەمی لە کۆرپەلەی ئاژەڵی بە شێوەیەك سیفەتە بۆماوەییەکانی بگۆڕدرێت بەمەبەستی گواستنەوەی ئەندامەکانی ئەم ئاژەڵانە دوای تەواو پێگەیشتنیان بۆ ئادەمیزاد لە حاڵتی پێویستدا .

٧- کۆپیکردنی ئەو جینەی بەرپرسە لە دەردانی ئەو ئەنزیمەی بەرپرسە لە تواندنەوەی خوێن مەین لە خوێنهێنەکاندا.

مەسەلەی دروستکردن : ئارەزایان لەسەر فکرەی وەچەخستنەوە دەڵێن ئەوەی زانایانی بۆماوەیی ئەنجامیاندا لە کۆپیکردنی مەڕی دوللی جۆرێکە لە دروستکردنی بونەوەرە کۆپیکراوەکە،وە بۆ وەڵامی ئەمە دەڵێین،لەڕاستیدا وەچەخستنەوە دروستکردنێکی نوێ نیە چونکە (ویلموت)لە وەچەخستنەوەکەیدا بۆ مەڕەکە نە خانەی دروست کرد و نە ناوك و نە سیتۆپلازم بەڵکو کەرەسەکانی لە لە خودای پاك وبێگەردەوەبوو وە ئەم داهێنانە زانستی یەی کە ناوبراو پێی هەڵسا لەسەر بونەوەرانێك ئەنجامدا کە خودا دروستیکردوون،وەبەفەزڵی عەقڵی ئادەمیزاد کە خودا پێی بەخشیوە وە ئەوەی ویستی لەسەر بووە فێری مرۆڤی کردوە دوای ئەوەی خودای پاك وبێگەرد هانی مرۆڤی داوە بۆ زانست و زانیاری و مشورگێڕی و بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خودا .

# بەشی دووەم

## بڕیاری ئەنجومەنی کۆمەڵەی جیهانی فیقهی ئیسلامی

## (دەربارەی کۆپیکردنی ئادەمیزاد)

**بڕیاری ژمارە ١٠٠/ ٢/ د١٠ دەربارەی کۆپیکردنی ئادەمیزاد**

ئەنجومەنی کۆمەڵەی جیهانی فیقهی ئیسلامی لە دانشتنی خولی کۆنفرانسی دەیەم لە جەددەی شانشینی عەرەبی سعودیە لەماوەی (٢٢ تا ٢٨ /صفر ١٤١٨ هـ بەرامبەر (٢٨ یونیو – ٣یولیو ١٩٩٧ز ) دوای بینینی ئەو توێژینەوانەی لە بابەتی کۆپیکردنی ئادەمیزاد پێشکەش کرابوون،وە لێکۆڵینەوەکان و توێژینەوکان و ڕاسپاردەکانی کۆڕی نۆیەمی فیقهی پزیشکی کەڕێکخراوی ئیسلامی بۆ زانستە پزیشکیەکان ڕێکیخستبوو بە هاوکاری لەگەڵ کۆمەڵەی جیهانی فیقهی ئیسلامی لایەنەکانی تر لە دار البیضاء لە شانشینی مەغریب لەماوەی (٩-١٢/صفر١٤١٨ هـ بەرامبەر (١٤-١٧/ یونیو ١٩٩٧ز) وە گوێگرتن لەو گفتوگۆیانەی کە دەربارەیئەم بابەتە ئەنجامدراوە بەەبشداری پزیشکە فەقیهەکان بەمانەی خوارەوە کۆتایی هات : خودا مرۆڤی لە باشترین شێوە دروست کردوە وە ئەوپەڕی ڕێزی لێناوە، خودای بالاّ دست دەفەرموێت ﴿ولقد كرمنا بني آدم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا﴾

بە عەقل جوانی کردووە وە شەرەفی ئەرك پێسپاردنی پێداوە،وە بە جێنشینی گێڕاوە لەسەر زەوی بۆ ئاوەدان کردنەوەی، وە ڕێزی لێناوە بەو پەیامەی کە گونجاوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ بەڵکو ئەو پەیامەش خۆی

فیترەتە هەروەك خودا دەفەرموێت ﴿فاقم وجهك للدين حنيفاً فطرة الله التي فطر الناس عليها لاتبديل لخلق الله ذلك دين القيم ﴾ وە ئیسلام سورە لەسەر پاراستنی پاکی فیترەتی مرۆڤ لەڕێگەی پارێزگاریکردنی هەر پێنج مەبەستە گشتی یەکەی دین .

ڕاو بۆچونی هەڵبـژێردراو : ئەو قولەی دەڵێت هەموو حاڵەتەکان حەرامن قەدەغەکراون ئەم جۆرە قەولە پێویستی بە زیاتر تێڕوانین و لێکۆڵینەوە هەیە، وە بێ گومان گرنیەکەی کەمی دەبێت،بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە تێگەیشتنی حاڵەتەکانەوە، وە قەدەغە بوونی لە هەموو حاڵەتەکان،جگە لە یەك حاڵەت نەبێت کە ناکرێت جێگەی ناکۆکی بێت،چونکە پەیوەندی هەیە بە گواستنەوەی تۆو لە پیاوێکی بیانی،وە هێلکۆکەی ژنێکی بیانی بۆ ناو ڕەحمی ژنێکی بیانی کە خاوەنی ئەم هێلکۆکەیە نیە ئەمەش بە کۆڕا حەرامە .

وە لەسەر بنەمای ئەمانەی پێشەوە لە توێژینەوەکان و گفتوگۆکان و بنەما شەرعیەکانی کە پێشکەش کە خرانە بەردەم ئەنجومەنی کۆمەڵەی جیهانی فیقهی ئیسلامی ئەمەی خوارەوە بڕیاردرا :

یەکەم: قەدەغەکردنی کۆپیکردنی ئادەمیزاد بەهەردوو ڕێگەکەیەوە کە دەبێتە هۆی زیادکردنی ئادەمیزاد .

دووەم: ئەگەر حاڵەتەکە تێپەڕبوو لەم حوکمە شەرعیەی ڕونکراوەتەوە لە برگەی (یەکەم) ئەگەر ئەم حاڵەتانە بەرپابوو ڕوبەڕووی حوکمی شەرعی تایبەت بەخۆی دەبێتەوە .

سێیەم: قەدەغەکردنی هەموو ئەم حاڵەتانەی کە لایەنی سێیەمی بکەوێتە نێوان پەیوەندی هاوسەرێتی، چ لایەنی ڕەحم یان هێلکۆکە یان خانەیەکی جەستەی بۆ کۆپیکردن .

**چوارەم:** لەرووی شەرعەوە رێپێدراوە پسپۆریەکانی کۆپیکردن و هەندەسەی بۆماوەیی وەربگیرێت لە بوارەکان میکرۆبەکان و گشت بەنەوەرە وردیلەکان و رووەك و ئاژەڵی لە سنوری حوکمە شەرعیەکان بەمەبەستی بدیهێنانی بەرژەوەندی یەکان و لابردنی زیانەکان .

**پێنجەم:** بانگهێشت کردنی دەوڵەتانی ئیسلامی بۆ دەرکردنی یاساو رێنمایی پێویست بۆ داخستنی هەموو دەرگاکانی راستەو خۆو ناراستەوخۆ لەبەردەم لایەنەکانی ناوخۆیی و بیانی ودەزگاکانی توێژینەوە و شارەزا بیانیەکان بۆ رێگەگرتن لەوەی ولآتانی ئیسلامی ببێتە گۆرەپانی تاقیکردەوەکانی کۆپیکردتی ئادەمیزاد و برەو پێدانی .

**شەشەم:** بەدواداچوونی هاوبەش لەلایەن هەریەك لە کۆمەڵەی جیهانی فیقهی ئیسلامی و رێکخراوی ئیسلامی بۆ زانستە پزیشکیەکان بۆ بابەتی کۆپیکردن و گۆرانکاریە زانستیە تازەکانی وە رێکخستنی زاراوەکانی،وە بەستنی کۆرو چاوپێکەوتنی پێویست بۆ رونکردنەوەی حوکمە شەرعیەکانی تایبەت بەم بابەتە.

**حەوتەم:** بانگهێشت کردن بۆ پێکهێنانی لیژنەکانی تایبەتمەند کە شارەزایانو زانایانی شەرعی لەخۆی بگرێت بۆ دانانی حوکمە ئەخلاقیەکان لە بواری توێژینەوەی زانستەکانی زیندەوەرزانی (بایەلۆجی) بۆ پشت پیبەستنیان لە دەولەتانی ئیسلامی

وە ئەم حاڵەتەی دەتوانم بڵێم رێپێدراوە بریتی یە لەوحاڵەتەی کە ئەگەر تۆوەکە لە پیاوێکەوە بێت و هێلکۆکە لە ژنێکەوە بێت، پاشان کۆرپەلە پیتێنراوەکە بەرێگەی (استتام) بۆ ناو رەحمی هەمان ژن،ئەمەش لەبەر ئەمەی خوارەوە: یەکەم: کۆپیکردن (استتام) ی ئادەمیزاد جیاوازە لە کۆپیکردنی ئاسایی تەقلیدی کە بۆ مەری دوللی ئەنجامدرا، چونکە (استتام)

بەگوێرەی مەنهەجی سروشتی ئەنجام دەدرێت بۆ زاوزێکردنی نێوان دوو هاوسەر —وەك ئەوەی پێشەو- وە کرداری جیاکردنەوەی خانەیەك لە خوشکە خانەکەی کە بەڕێگەی زانستی ئەنجامدەدرێت —لەڕووی بنەماوە — هیچ مخالەفەیەکی شەرعی تێدا نیە پاشان چاندنەوەی یەکێك لەم خانانە بۆ تەواوکردنی ڕێڕەوە سروشتیەکەی بە ئیزنی خودای بالآدەست مخالەفەیەکی شەرعی تێدانیە، تاکە گرفت لەو مەسەلەیە بریتیە لە کۆپیکردنی زیاتر لە جەنینێك وەك ئیحتیات بۆ حاڵەتەکانە سەرکەوتوونەبوونی چاندنی جەنین تاوەکو بەدیلی خێرا هەبێت، وەئەمەش هەروەك دەبینین ناکامەکەی یان مردنی جیناتەکان دەبێت یان چاندنیان لە رەحمی ژنێکی تر کە هەردوو بارەکەش حەرامن .

فتوایەك لە کۆمەڵەی جیهانی فیقهی ئیسلامی (بریاری ٥٥) (٦/٦)

یەکەم : لەژێر ڕۆشنای ئەوەی بەزانستی بەدیهاتووە لە توانینی پاراستنی هێلکۆکە نەپیتێنراوەکان، پێویستە لەکاتی پیتاندنی هێلکۆکەکان رەچاوی ژمارەی پێویست بکرێت بۆ چاندنیان لە هەرجارێکدا .بۆ دورکەوتنەوە لە هێلکۆکە پیتێنراوەزیادەکان .

دووەم : ئەگەر هێلکۆکەی پیتێنراوی زیادە بەدەستهات بەهەر ڕێگەیەك لە ڕێگەکان وازیان لێنهێنرێت بەبێ چاودێری پزیشکی تاوەکو ئەم زیادانە بەشێوەیەکی سروشتی ژیانیان کۆتایی دێت .بەکارهێنانی هێلکۆکەی پیتێنراو لە ژنێکی تر حەرامە، وە پێویستە ڕێو شوێنی پێویست وەربگیرێن بۆ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی هێلکۆکەی پیتێنراو لە حەملێکی ناشەرعی، وەلێرەدا ئەم بریارە بەتەواوی جێبەجێ دەکەین لەسەر ئەو حاڵەتەی تایبەتە بە منالی (الاستتام) وە دەڵێین ئەم کۆرپەلانە تەنها لە دەرەوە دەپیتێنرێن وازیان لێ دەهێنرێت وپاشان دەگەرێنرێنەوە بۆ ناو رەحم، پاشان ئەم تنۆکە ئاوەی کە هێشتا لەناو رەحمدا جێگیر نەبووە هیچ قودسیەتێکی مرۆیی نیە لەلای هەموو فەقیهەکانی پێشومان ئەوانەی کە

هەنگاویان ناوە بەرەو (نطفة- تنۆکەئاو-) وە جمهوری ئەم فەقیهانە قودسیەتی ژیان نادەن بە حاڵەتەکانی سەرەتایی کە برتین لەحاڵەتی پیتاندنی هێلکۆکە بە تۆو لەناو رەحمدابیان دەبێتە خوێنپارە (مضغة) وە باس دەکەن کە ئەمە لە حاڵەتی پێش ژیانە، لە ئاستی بەڵگەکان لە قورئان و سونەتدا بەڕونی دەبینین کە کۆپیکردنی ئادەمیزاد ڕووبەڕوی هەموو دەقەکانی پەیوەندار بە زاوزێکردن و زۆربوونی ئادەمی دەبێتەوە بە پێی ئەم ڕێگەیەی ناسراوەو هەیە لەسەر بنەمای گەیشتنی هێلکۆکە بە تۆو لە میانی بەیەکگەیشتنێکی جنسی ڕاستەوخۆی نێوان دوو هاوسەر، وپاشان دروست بوونی پیتاندن یان تنۆکە ئاوێکی ئامادە بۆ گەشەکردن بە دابەش بوون و پلەداری تاوەکو دەبێتە کۆرپەلەیەکی تەواو بەنیزنی خودای بلاّدەست .وە ئەم دەقانەی لەم بوارەوە هاتوون زۆر زۆرن، وە دەکرێت هەندێکیان بهێنرێنەوە بۆ مەبەستی وەبیرهێنانەوەی ماناکانیان کە حەقیقەتی زیادبوونی ئادەمیزاد لە ڕێگەی جوتبونی دووهاوسەر ڕون دەکەنەوە کۆپیکردنی ئادەمی حەرام وڕێپێنەدراوە،وە لە تاوانە گورەکان ئەژماردەکرێت وە گەورەترین تاوانکاریەکانی ئاینی و مرۆڤایەتی ومێژوویی یە وە بەجۆرێك لە جۆرەکانی خراپەکاری لە زەویداو لەناوبردنی وەچەو نەوە دادەنرێت،وە خوداش خراپەکارانی خۆش ناوێت، وە بەڵگە ناهێنمەوە لەسەر ئەوەی هەروەها ناکۆکە لەگەڵ دەقە ڕون وئاشکراکان وبەڵگەو قرینە شەرعیەکان،وە دەبێتە هۆی لەناوبردنی مەبەستە شەرعیەکان ومەرام وئامانجەکانیان،وە ڕوبەڕووبونەوەی لەگەڵ ڕێنمایەئاینیەکان وقیەم و بیرو باوەڕەکان، وە مخالف بوونی لەگەڵ عەقڵ وهۆشی ساغ وسەلیم وفیترەت وژیری و واقع.

# بەشی سێ یەم

## بەناوبانگترین زانایانی وەچەخستنەوە لەرێگای کۆپیکردن

سەرەتای کرداری وەچەخستنەوە لە رێگای کۆپیکردنەوە دوای کاتێکی کەم زیادکردنی کۆپیکردن لەسەر ئاژەڵان و ڕوەك ئەنجامدرا سەرەتا لە کۆتاییەکانی شەستەکان و پشت بەستن بە زانستی پێشکەوتوو هەردوو زانای ئەمریکی (دکتۆر بریجز،ودکتۆرکینج-پێی هەستان،دکتۆر جوردونلە زانکۆی اکسفۆرد هەستا بە جێبەجێکردنی زیادکردنی کۆپیکردن لەسەر بۆقێکی ئەفریقی چڕنوکدار،بەشێوەیەك تیشکی زوور بنەوشەیی بەکارهێنا بۆ تواندنەوەی ناوك لە هێلکۆکەی ئەپیتێنراوی ئەم بۆقە،داخل کردنی ناوکەکانی ئەم خانەجەستەییانەی کە لەوبۆقە وەرگیراون بۆ ناو ئەم هێلکۆکەیە لەرێگەی نەشتەرگەریەکی وودر،وبەبەکارهێنانی ئامێرێکی پارمەتیدەر بۆ ڕێنمایی پێدان لەناو بلازمای هێلکۆکە فەرمان دەکات بە ناوکەکە بە دابەش بوونی تەواوەتی وەکو ئەوەی هێلکۆکەکە شێوازەکانی خۆی تەواو بکات لە ڕێگەی پیتاندنی بە تنۆکە ئاوێك وە دابەش بوونەکان بەردەوام بوون تاوەکو بۆقێکی نوێی پێکهاتە تەواو دروست بوو . دکتۆرە بیاتریس منتز لە دەزگای توێژینەوەکانی شێرپەنجە لە فلادفیا گەیشتە دوو ڕێگە کە نزیکن لە کۆپیکردن،یەکەمیان ئەو کۆپی یەی لە لێکهەڵوەشانی جیناتەکان دروست دەبێت،وە دوەمیان بەیەکەوەبەستنی جیناتەکان ودروستکردنی بونەوەرانێك هەردوو دایك وباوکیان هەبێت لە جیاتی یەك (دایك یان باوك)، وە ڕێگەی یەکەم ئێستا زانراوە کە بریتی یە لە هەمان

ئەو ڕێگەیەی ستیلمان و هول بلاویکردەوە لەسەر جیناتی ئادەمی ساڵی ١٩٩٣، بەلام درێژەی ڕێگەی دووەم واتە پێکەوە نوساندنی جەنینی ئاوبراو پێی گەیشت لە میانی توێژینەوەکەی لەبارەی ناوەندە بەسودەکانی بایەلۆجی بۆ دراسەکردنی جیاکردنەوەی خانەیی و دروستکردنی خانەکانی جەنینی .

کرداری وەچەخستنەوە وچۆنیەتی قۆناغی وەچەخستنەوە: مەبەست لە لە دایك بوونی خانەیی – ناجنسی - لەڕێگەی دابەشبوونی خانەی مێینە، یان هێلکۆکە – دوای چەندجارە بوونی شێوەکانی – بەبێ پیتاندنی لەلایەن خانەی نێرینە،یان تنۆکە ئاو دەبێت،هەروەك لە لە دایك بوونی جنسی ڕودەدات . وە لەهەردوو حالەتەکە ئەنجامەکە وەك یەکە،کە لە هێلکۆکەوە کۆرپەلەیەکی ڕێك دروست دەبێت . وە ئەمەش ئەوەبوو کەلە تاقیکردنەوەی مەڕی دوللی بەدەست هات،وە تاقیکردنەوەی تریش کە لەمەودوا زانست لە داهاتوودایێی دەگات . لە شوباتی ٢٠٠٣ مردنی مەڕی دوللی لەلایەن زانایان ڕاگەیەنرا، ئەو مەڕە بەناوبانگترین بوو لە جیهاندا،کە یەکەم ئاژەڵی شیردەر بوو تاقیکردنەوەی کۆپیکردنی لە خانەیەکی پێگەیشتوو بۆ ئەنجادرا . وە ڕاگەیاندنی مردنی دوللی لە کات وساتی ڕاگەیاندنی لە دایك بوونی منالێکی کۆپیکراو بوو –هەرچەندە ئەم پێشکەوتنە تا ئێستاش ناڕۆشنی لەخۆی گرتووە .مردنی دوللی ئەم زەجەجەیەی نەنایەوە کە لەکاتی لەدایگ بوونی بەرپا بوو هەروەها زانایان هۆکاری مردنی دوللی یان بەووردی ڕون نەکردەوە لەگەڵ ئەوەشدا مردنی دوللی پرسیارێك دێنێتە ئاراوە دەربارەی شوێنەوارە دورەکانی کرداری کۆپیکردن لەسەر مەخلوقی کۆپیکراو، وە فرسەتێك ئەدات بە مرۆڤ بۆ بیرلێکرنەوە لەو بابەتە .

وە لـە سـاڵی ١٩٥٣ز زانایـان (واتـسون) و٠ کریـك) بونیـەی ڕاستـەقینەی پێکهاتـەی مـادەی( ) یـان دۆزیـەوە کـە ملکەچـە بـۆ هـەموو فەرمانـەکانی دروسـتکەرەکەی لـە پابەنـدبوون بـەو فەرمانانـەی ناراسـتەی دەکرێـت لـە دروست بونی خانەکان ـسیفەتەکانیان وتایبەتمەندیەکانیان وئەنزیمـەکانیان وفەرمانەکانیان . پاشان زانا جۆن کیردن لـە سـاڵی ١٩٦٢ لـە زانکۆی اکسفۆرد هەستا بـە ئەنجامـدانی محاوەلـەی یەکـەمی لەسـەر بۆقـەکان وە لەساڵی ١٩٩٣ دەستکرا بە هەوڵەکان لەسەر مرۆڤ لە ئەمریکا لەلایەن ستمان،ودهول،پاشان ئـەم تاقیکردنـەوە جـێ بـەجێکراو لـە سـاڵی ١٩٩٧ لـە ولایـەتی اوریجـونی ئەمریکی کۆرپەلـەکانی مەیمونەکانسـەرکەوتوو بـوو لـە وەچەخستنەوە لـە ڕێگـای کـۆپیکردنی دوانەیەکیمـەیمونی ریـزوس بـە ڕێگـەی کـۆپیکردنی کۆرپەلـەکان یـان وەچەخـستنەوەی جنـسی کـە ئـەم دوانەیـە ناویـاننرا :نیتی،ودیتو، وە ڕێگەیەکە جیاوازە لە ڕێگەی کۆپیکردنی مـەڕی دوللی . وە لە ١٩٩٧/٢/٢٧ هەردوو زانای اسکتلندی (ایان ویلموت) و( دکیـپ کامبـل) بـە هاوڕێیـەتی تیمێـك لـە زانایـانی پـەیمانگای روزلـین لـەدایك بـوونی مـەڕی (دوللـی) یـان ڕاگەیاندـبـە ڕێگـەی کـۆپیکردن بەڕێگـەی چـاندنی نـاوکی خانەیەکی جەستەیی لە ناو هێلکۆکەیـەکی نـاوك دەهێنـراو، وە ئـەوەی نـوێ وجێگەی تێڕامان بـوو لـە سـەرەتای ئـەم جـۆرەدا بریتـی بـوو لـەوەی کـە لـە ڕێگـەی خانەیەکـەوە وەرگـیراوە، بـەلاّم کـۆپیکردنی جینـی لـە سـەدەی بیستەمەوە هەبوو بۆ باشکردنی وەچەی ئاژەڵان لە ڕێگەی پیتاندنی صناعی لەناو ڕەحـم یان لـە دەرەوەی ڕەحـم .وە بـۆ سـەرکەوتی کـرداری کۆپیکردن پێویـستە خانـە هـەبێت، بەخـشەری نـاوك، لـە قۆناغێـك لـە قۆناغـەکانی دەورەی خانـەیی بـۆ حەقیقیاتـەکانی نـاوك : پێویـستی هەیـە بـە گەشـەی حەقیقیاتەکانی ناوك - کە بریتی یە لە زیندویی خاوەن خانەکانی بەناوکی

جیابۆوە لە ستوپبلاسم بەهۆی بەرگە ناوك – زیادە لە کوتلەی خانەدا،وە چەندجارەبونەوە لە مادەی جینی، وە دابەشبوون .کە بەردەوامبوونی بەدواداهاتنی نەوەکان دەستەبەر بکات ......وە ئەم رووداوانە لە سیستەمێکی وودر ڕوودەدەن لە ماوەی ژیانی خانەناسراوە بە دەورەی خانەیی لە سەرەتادا خانەی جووت چەشن (٢n کروموزوم) بە ماوەی گەشەو زیادبوونی کوتلەکەی تێدەپەڕێت بەدوایدا ماوەی G1 {growth} ە سەبارەت بەو خانەی دەورەکەی (٢٤) کاتژمێرەماوەی G1{growth} نزیکەی دە کاتژمێری سەرەتای ژیانی بەردەوام دەبێت – وە ئەم ماوەیە تایبەتکراوە بۆ گەشەی خانەکە وئامادەکردنی بۆ پێکهاتەی کیمیایی بۆ پێکهاتەی ال.د.ن. ا. وە لە کتێکی دیاریکراو چەندجارەبوونەوەی مادەی جینی دەست پێدەکات – وە لەکاتی پێکهاتەی ال.د.ن. کە ماوەی (synthesis ) دەخایەنێت واتە نزیکەی نۆ کاتژمێر د.ن.ا. کۆپیدەبێت هەموو کرۆموزۆمەکان . دوای ئەمە خانەکە دەچێتە قۆناغی دووەم لە گەشەکردن ین ماوەی g2 کە هەمیشە چوار کاتژمێر دەخایەنێت،وە بەردەوام دەبێت تا کۆتایی ماوەی دابەشبوونی تەختیتی m- mitosis،کە نزیکەی کاتژمێرێك دەخایەنێت –وە لەماوەی m1 وماوەی تەختیت،هەریەك لە جوتە کرۆموزۆمی برا لەیەك جیادەبنەوە یەکێك لەوی تر،وە هەریەك لەوجووتە (کروماتید) ە ڕێگە دەگرێت بەرەو یەکێك لە دوو خانە مێنەکە .

## تەوەرەکانی وەچەخستنەوە

بۆ زیاتر ئاسانکردن باسی ئەو تەوەرەزانستیانە دەکەین کە وەچەخستنەوە ی لەسەریان وەستاوە،وە بریتین لە :

١- خانە : کە جەستەی بونەوەرەزیندوەکان لە کۆمەڵێك خانە پێکهاتووە ئەوەش وەکو پێکهاتەی خانووە لە بەردوو شتی تر، وە ئەم خانانە جووتن هەروەك خودای بالادەست دەفەرموێت ﴿ سبحان الذي خلق الازواج كلها مما تنبت الارض ومن انفسهم ومما لايعلمون﴾ – سورة يس ،الآية ٣٦- وە هەروەها کە لە ناو هەر خانەیەك ناوکێك هەیە کە بریتی یە لە نهێنی چالاکی ژیانی خانەکە،وەدەوری ئەم ناوکە دراوە بە بەرگە خانەیەك کە تۆرێکی پێکهاتوو لە ٤٦کرۆمۆسۆم لەخۆی دەگرێت واتە شریتێکی رەنگ چەشنی رەش بۆیە پێی دەوترێت (صبغيات – چەشنەکان) کە لە سیفاتە بۆماوەییەکان خۆی دەنوێنێت،وە لەنێوان ناوك ودیواری خانەکە پڕە لە شلەیەکی خانەیی (السيتوبلازما) وەخانەکە بەدابەشبوون زۆر دەبێت.

٢- خانەی جنسی:

بریتییە لەو تۆوەی کە گون دەریدەدات، وە ئەو هێلکۆکەی کە هێلکەدان دەریدەدات، وە ئەم خانەیە تایبەتمەندیەکی هەیە کە لە دابشبونەکەیدا بەدیاردەکەوێت .ئەم خانەی جنسییە کەرت نابێت بۆ دوو نیوەی وەك یەك و شریتی کرۆمۆسۆمی بەڵکو جسمەکانی چەشنی- الصبغيه- بە سەلامەتی دەمێننەوە،وە نیوەی دەڕوات تا ببێتە ناوکی خانەیەك،وە نیوەکەی تری تا ببێتە ناوکی خانەیەکی تر،بۆیە ناوکی ئەم خانە نوێ یە ٢٣ کرۆمۆسۆمی تاك لەخۆی دەگرێت ئەگەر هێلکۆکە پیتێنرا بە تۆو ئەمە

**مانــای وایــە هــەردوو ناوکەکــە پێکەوەنوســان لــە یــەك ناوکــدا کــە ٢٣ کرۆمۆسۆمی جووت پێکدێت،٢٣ تاك لە تۆو،وە ٢٣ تاك لە هێلکۆکە .**

**وە ئەمــە ئــەوە بــوو کــە باسمــانکردو بــووە پاڵنــەر کــە بــووە هــۆی دروســتبوونی دیــاردەی کــۆپیکردن ســەرهەڵدنی لەســەر ئاســتی زانــستەکانی بایەلۆجی و هەندەسەی بۆماوەیی،چ ئەو پاڵنەرانــە ڕاستەوخۆو ڕون ودیــارو ڕاگەیەنراوانــەی پەیوەســـتن بـــە خزمـــەتی هەنـــدێك ئامـــانجی زانـــستی توێژینەوەو ئابووری .**

# پاڵنەرەکانی وەچەخستنەوە

## یەکەم: پاڵنەرە دیارو ڕاگەیەنراوەکان بۆ وەچەخستنەوە لەرێگای کۆپیکردن

ئـــەم پاڵنەرانەپەیوەســـتن بـــە بـــواری ئـــابوری و تەندروســـتی و توێژینەوەیی،بەم شێوەیەی خوارەوە :

١- بەهێزکردنی ئابووری :

عونـصری ئـابووری یـەکێك بـوو لـە پاڵنەرەگرینگـەکان لـە بـەرپابونی کـــۆپیکردن وە بـــەردەوام بـــوونی تاقیکردنـــەوەکان و لێکۆڵینـــەوەکان و پارمەتیدانی پەیمانگاکان و دەزگـا زانـستیەکان و بایەلۆجیـەکان بەمەبەسـتی بـەهێزکردنی ئـابووری و گەشـەپێدان و باشـکردنی بـەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵی وە بەدیهێنانی جۆری نوێ و نایاب، وە زۆر کردنی بـە ڕێژەیـەکی زۆر لە شیرو گۆشت و خوری ومیوەو گیاکان،وە بواری کشتوکاڵی و ئاژەڵی وای لـێ بکرێـك کـە بتوانرێـت خـۆی بگرێـت بەرامبـەر کارەسـاتەکان و حەشـەرات وئافات و نەخۆشیەکان .

٢- زۆر کردنی دەرمان و پاڵپشتی کردنی تەندروستی مرۆیی :

هـەروەها عونـصری تەندروسـتی یـەکێك بـوو لـەو پاڵنـەرە گرینگانـەی بـەرپابوونی لـە رێگـای کۆپیکردنئەمـەش لـە ڕێگـەی بـەرگری کـردن لـە نەخۆشـیە بۆمـاوەیی یـەکان وەك شـەکرەو پاڵەپەسـتۆی خـوێن و ڕەق بـونی دەمارەکان و شێرپەنجەو دڵ و بەرگری زاتی، ئەمەش لـە ڕێگـەی ئـەوەی کـە ناسـراوە بـە سـەروکاری کـردن لـە بەرنامـەی بۆمـاوەیی و چارەسـەرکردنی

جینی، یان چارەسەر کردنی جیناتە مرۆییە خراپ بووەکان کە بەهۆیەوە مرۆڤ لەدایک دەبێت .

٢- پێشکەوتنی توێژینەوەکانی بایەلۆجی :

لە پاڵنەرە ڕاستەوخۆکان و پلەی پێشەوە لە قەزیەی کۆپیکردن : پێشکەوتنی توێژینەوەکانی زانستەکانی بایەلۆجی و هەندەسەی بۆماوەیی و چارەسەری جینی یە، وە کارکردن لەسەر ئەوەی کە بکرێت بە بوژانەوەیەکی زانستی لە سەدەی داهاتوو،وە بکرێت بە دەستکەوتێکی گەورەی شارستانیەت لە هاوشێوەی دۆزینەوەزانستی یەکانی تر کە لەکاتی خۆیاندا خەڵکیان سەرسام کرد،وەکو دۆزینەوەی گەردیلەو،هی تریش .

دووەم : پاڵنەرە شاراوەکان یان چوارچێوەی فەلسەفی گشتی کۆپیکردن : لەوانەیە ئەم پاڵنەرانە لە پاڵنەری ڕاستەوخۆو هۆکاری نزیك نەبن لە بەرپابونی کۆپیکردن و بەدیارکەوتنی لە مەیدانی زانستی و واقعی مرۆڤایەتی جیهانی بەو شکل و شێوەیە .وە لەوانەیە پێویست نبێت ئەم پاڵنەرانە دەربڕدرێن، ئەوانەی هەڵدەستن بە کرداری کۆپیکردن ئەم پاڵنەرانە لە کارەکانیاندا چڕ دەکەنەوەو بۆ ڕێگەدان بە تاقیکردنەوەوکارەکانیان،وە ڕاگەیاندنی ئەنجام و ئافاتەکەی.

سێیەم: کۆپیکردن لەبەر نەبوونی ئەخلاقیاتی زانستەکان :

قەزیەی عیلم و ئەخلاق لە قەزیەکانی فەلسەفەی کۆنە،واتا بەدیهیی یەکشی بریتیە لە پێویستی پەیوەست بوونی عیلم بە ئەخلاق و قیم و بەها مرۆڤایەتیەکان،وە پابەند بوونی بە هەموو ئەوانەی خێرو خۆشی بۆ مرۆڤایەتی دەگێڕێتەوە نەوەك تێکدان و لەناوبردن .وە دروشمەکانی ئەمانەتی زانستی و ئەخلاقیاتی پزیشکی و ئادابی زانایان و خۆ

بەکەمزانینیان هەمووی بەلگەن لەسەر پێوەری ڕەوشتی زانستی . لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرمان دراسەی بابەتەکە بکەین لەو قوناخەی کەوتۆتە پێش خودی کردارەکە،واتە دۆزینەوەی پالنەرەکانی ئەم پرۆژانە،وە ئەو حەقیقەتانەی کە لەسەری وەستاوەو تایبەتە بە مرۆڤایەتی و کۆمەلگا بەگشتی.ئەم جۆرە تەدەخولە لە سروشت لە مرۆڤی کۆپیکراودا نابینرێت کە تەنها هەلگری جینێکی دیاریکراوە پاشان هەلدەبژێردرێت بەهۆی سیفەتە دیاریکراوەکانی.

# سەرەباسی سێ یەم

## هەڵوێستی یاساکان و هەیئاتەکانی نێودەوڵتی

## بەشی یەکەم

### هەڵویستی یاسای عێراقی بە غەیری خۆی لە یاساکان

هەڵویستی یاسای عێراقی جیاواز نی یە لە یاساکانی دەوڵتانی تر،بەشێوەیەك دەقێکی روون وئاشکرا نابینرێت چارەسەری ئەم کردارانە بکات قەدەغەیە یان رێپێدراوە، بۆیە بە ناچاری دەگەرێینەوە بۆ بنەما گشتی یەکان لەم یاسایانەو گەران بە دوای بۆچونی فەقیهەکان شەریعەی ئیسلامی لەبەر ئەم هۆیەی باسمانکرد . ماددەی (٢٢) لە دەستوری ئێستای عێراقدا لەم بارەیەوە دەڵێت (١- کەرامەتی مرۆڤ پارێزراوە ........) هەروەها لە پرۆژەی نوێی دەستوری عێراقدا هاتووەکە (سەربەستی مرۆڤ وکەرامەتی و شەرەفی پارێزراوە،وە رێگە نادرێت دەستدرێژی زۆردارانە یان نا یاسایی بکرێتە سەر تایبەتمەندیەکانی هیچ کەسێك ) وە لەم بنەما سەرەکیانەی کە لە سەرەوە باسکراون ئەمە بەدەست دەهێنین کە یاسای عێراقی قەدەغەی کردووە تاقی کردنەوەی زانستی ئەنجامبدرێت لەسەر مرۆڤی نەخۆش تەنها لەکاتێك نبێت ئەگەر بۆ مەبەستی زانستی صرف بێت بەمەرجێك لە بنکەکانی توێژینەوەی زانستی،یان پەیمانگاکانی زانستی ئەنجام بدرێت، وە مەرجە لە جێ بەجێ کردنی تاقیکدنەوەکانی زانستی کە دەبێت ئەو تاقیکردنەوەیە شیاوی توێژینەوەی زانستی بێت لەسەر مرۆڤ بێت یان لە ئاژەڵدا، وە قەدەغەکردنی هەر تاقیکردنەوەیەك کە مەترسی تێدابێت لەسەر ژیانی کەسەکە، وە لە هەموو حاڵەتەکان پێویست رەزامەندی نەخۆش وەربگیرێت . بەلام ئێمە پێمانوایە ئەم جۆرە

تاقیکردنەوانە قەدەغەکراون چونکە پەیوەندی بە کەرامەتی مرۆڤەوە هەیە بە پشت بەستن بە دەقەکانی دەستوری عێراقی و ئەو بنەما گشتی یانەی کە سیـــستەمی کۆمەلأیـــەتی عێراقـــی لەســـەر وەســـتاوە،وە بەلگەنامـــەکان وڕێککەوتنە نێودەوڵەتیەکانی تایبەت بەمافەکانی مـرۆڤ بـەو ئیعتبـارەی کـە عێراق یەکیکە لەو دەوڵەتانەی کە ئیمزای کـردووە لەسـەر ئـەم بەلگەنامانـە وە جـێ بـەجێ کردنـی ئـەم بنەمایانـە دەمانگەیـەنێت بـە قەدەغـەبوونی ئەنجامـدانی هـەموو کردارێـك لـە کردارەکـانی هەندەسـەی بۆمـاوەیی کـە مەبەستی چارەسـەرکردنی نەخۆشـی یـان کـەم وکورپـەك یـان ناتەواویـەکی لەپشتەوە نەبێت،جا ئـەم ناتەواویـە یـان نەخۆشـیەچ پەیوەنـدی هـەبێت بـە خودی کەسەکە یان بە زوریەتەکەی،وە لێرەدا ئەگەڕێینەوە بۆ ئەو قسەیەی لـە بـارەی هەڵویـستی فیقهـی ئیـسلامی وشـەریعەی ئیـسلامی دەوترێـت دەربارەی ئەشـتەرگەری جوانکـاری . بەمـەرجێك نابێـت ئـەم قەدەغەکردنـە بکرێتە بیانویەك لەبـەردەم پێشکەوتنی زانـستی، بـەلأم هیـچی تێدانیـە کـە تاقیکردنـــەوە زانـــستی یـــەکان بەگـــشتی و تاقیکردنـــەوەکانی هەندەســـەی بۆمـاوەیی بـە تایبـەتی بخرێنـە ژێـر تونـدترین پێـوەری زانـستی ونـەخلاقی وچاودێریەکی توند بەمەبەستی گرەنتی بەکارنەهێنانیان بۆ مەبەستی تـری نامەشروع.کاریگەری خراپی لەسـەر دامـەزراوەی خـێزان کە بریتـی یـە لـە روکنێکی پتەوی کۆمەلگاکان،کە کەڵك وسودو توانـای خۆی چەسپاندووە لـە سەردەمی ئـادەم وحـوا –سـەلامی خوایـان لەسـەر بێـت، وە هـەموو ئاینـەکان هانی ئەم دامەزراوەیان داوە،پارێزگاریان لێکردووەو بـەهێزیان کـردووە و لـە هەموو لایەکەوە چاودێریان کردووە .

# بەشی دووەم

## هەڵویستی هەیئاتەکانی ڕێکخراوەکانی نێودەوڵەتی

### قەدەغەکردنی وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد لە ڕووی یاساوە

ئەم قەدەغەکردنە هاتووەو گەڕانەوەی بۆ نییە سەرەتا لەسەر شێوەی ڕاسپاردە بەناونیشانی یاسای گشتی بۆ جینی ئادەمیزاد ومافی مرۆڤیونیسکۆ لەساڵی ١٩٩٧ پەسندی کرد پاشان لە ساڵی دوایی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان پەسندی کرد . ئەگەر سەیری ئەو قەزیانە بکەین کە ئەخلاقیاتی بایەلۆجیان لە خۆ گرتووە ڕوبەڕووی کۆمەڵێك پرسیار دەبینەوە کە بنەماکانی ڕۆشەنبیری و فەلسەفی و ڕۆحی درێژ دەکاتەوە بۆ کۆمەڵگا جیاوازەکان و پێکهێنانی هەماهەنگی نێوان ڕێزگرتنی ئەم ڕۆشەنبیریە هەمەجۆرەو نێوان پێویستی واقعی بۆ پێشکەوتنی زانستی بەمەرجی سەرەکی بۆ توێژینەوەی هاوبەش لە چوارچێوەی ئەخلاقیاتی بایەلۆجی .وە ئەوە ئەو ڕۆحیەتەیە کە ئێستا ئێمە کاری پێ ئەکەین لەسەر ڕاگەیاندنی جیهانی دەربارەی زانیاریە جینیەکان چونکە خراپ بەکارهێنانی ئەو زانیاریانە دەبێتە هۆی بەدیار کەوتنی شێوەی نوێ لە جیاکردنەوە بەڵکو هەتا دەبێتە هۆی پێشێلکاری ترسناك بۆ مافەکانی مرۆڤ .

وە یونیسکۆ زیاتر لەوەش ڕوبروی بۆوە بەوەی کە بانگهێشتی کرد بۆ کارکردنی مینبەرێك بۆ گفتوگۆکردن لە نێوان ڕۆشەنبیریە جیاوازەکان

وتێڕوانین و بیروباوەڕە دینیەکان‌بۆ گەیشتن بە چوارچێوەیەکی ئەخلاقی جیهانی ممارەسە پەسندکراوەکان دیاری بکات لە بواری کۆپیکردن و زانستەکانی جینات بەتەواوی ڕەت کراوەتەوە کە مرۆڤێك لەدایك ببێ بەگوێرەی مواصەفات هەتا ئەگەر ئەمە بەمەبەستی پێکهاتەیەکی جینی نمونەییش بێت.وە یونیسکۆ هەرزوو گرینگی ئەم قەزیەی هەست پێکرد کە سنوری دەوڵەتان و مافە تایبەتیەکان تێدەپەڕێنێت، وە داوای بەشداریکردنێکی کاریگەر لە زانایان وسیاسەتمەداران و ئابووری ناسان دەکات. وە یاسا حوکمی چالاکیەکانی خەڵکانی زیندوو دەکات وە پەیوەندیەکانیان بە یەکتری و هەڵسوکەوتیان لە کۆمەڵگادا ڕێکدەخات وە فەرمان دەدات بە پاراستنی ژینگەکەیان لە پیس بوون، سەرەڕای ئەوەی کە زۆرێك لە ڕێساکان و ئەحکامەکانی یاسا لەسەر ڕاستیەکان و ئیعتباراتی بایەلۆجی صرف دانراون ڕوداوی لەباربردن و مردن و ڕەچەڵەك و خزمایەتی بۆ نمونە وە ئەو نەخۆشیانەی کە کاریگەریان هەیە لەسەر ئیلتزامات و مافەکان هەموو ئەمانە ئیعتباری بنەڕەتیان بۆ دەکرێت لە دیاریکردنی ئەو ئەحکامە یاساییانەی پێویستە جێ بەجێ بکرێن لە بواری میرات و هاوسەرگیری و تاوان و سزا هی تریش .... وە گۆڕینیان و هەموار کردنیان بەگوێرەی گۆڕان لەو حەقائقانە وە ئەوەی دەتوانرێت بەدەست بێت لە گۆڕانی بایەلۆجی لەم بارەیەوە .

١- یونیسکۆ یەکەم هەینەی نێودەوڵەتی بوو کە پێشنیاری بەرنامەیەکی یەکگرتووی پتەوی کرد بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو قەزیانە/ یونیسکۆ قەدەغەکردنی وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزادی لەساڵی ١٩٩٧ پەسندی کرد پاشان لە ساڵی دوایی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان پەسندی کرد

أ- هەڵوێستی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی :

لە ١١/مارس/ ١٩٩٧ ز جاڕنامەیەکی ڕاگەیاند بۆ تەئکید کردنەوە لەسەر ئەوەی کە لەدایك بوونی ئادەمیزاد لە ڕێگەی کۆپیکردن (الاستنسال) لە ئەخلاقدا پەسند نی یەو پێشێلکاریە بۆ قودسیەتی ژیانی ئادەمی .

ب- ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا :

لە ڕێگەی یەکێك لە ئەندامانیەوە پرۆژەیاسای قەدەغەکردنی ئەم جۆرە توێژینەوەو تاقیکدنەوانە پیشکەشکرا .

ت- پەرلەمانی نەرویجی :

بڕیارێکی دەرکرد قەدەغەکردنی وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد.

ج -پەرلەمانی ئەرجەنتین :

پرۆژە یاسایەکی ئامادەکرد کە ئەو مەسەلەیە بە تاوان دادەنێت و سزای تاوانکاری توند ئەسەپێنێ بەسەر ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی وەچەخستنەوە لەسەر مرۆڤ .

وە داوای بەشداریکردنێکی کاریگەر لە زانایان وسیاسەتمەداران و ئابووری ناسان دەکات. یونیسکۆ یەکەم هەیئەی نێودەوڵەتی بوو کە پێشنیاری بەرنامەیەکی یەکگرتووی پتەوی کرد بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو قەزیانە،وە ڕەهەندێکی ئەخلاقی دانا کە بوارەکانی زانستە بایەلۆجیەکان لە سەرەوەی لیستەکە لە خۆی دەگرێت . وە یونیسکۆ بەردەوام بوو لە ئەرکی سەرپەرشتی کردن و پیشەنگی کردن ئەمەش لە ڕێگەی کارو صالاکی زۆر لە میانیان خولی "گفتوگۆکانی سەدەی بیست ویەك" کە جیروم بندی ڕێکیخست لە پاریس لە دەی ئەیلول ٢٠٠٤،وە پرسیارێکی زۆر پێویستی گرتبووە خۆی "ئایا پێویستە وەچەخستنەوە لە

ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد قەدەغەبکرێت ؟ ئەرکی من بەڕێوەبردنی گفتوگۆیە "کە تیایدا کەسایەتی وەك وەزیری فەرەنسی دکتۆر جان فرانسوا ماتتی و زانایان خوسیە ماریاکانتو و ولیام هارلبت وەکەسایەتی یاسای نێودەوڵەتی میرای دیلماس مارتی بەشداریان کردەوە ئەمە لە بواری تواناکانی وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد یەکەم بۆنە بوو کە ڕێگەی دا بە ڕەهەندی ئەخلاقی پێشەنگی ڕێڕەوی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیاو سەرکرداتیەکەی بێت – ئەگەر ویست و ئیرادە ی ئەمە هەبێت.

## کۆتایی

وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد جەنگێکە لەسەر مرۆڤایەتی و قیەم و شارستانیەت،و پرۆژەیەکە بۆ تێکەڵ کردنی سیستەم و سوننەنەکان وە هەڵگێڕانەوەی کاروبار و بارو دۆخەکانەئەمە لەوانەیە کە هەموو کەسێکی عاقڵ و تێگەیشتوو هەستی پێ دەکات وە بەڵگە ناهێنمەوە لەسەر ئەوەی کە سەرەتای جەنگی جیهانی سێیەمە،لە بانگهێشتەکانی جیهان و ئەنجامدانی چاوپێکەوتن و کۆڕ و کۆنفرانسەکان و ڕێکخستنی پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندنەکانی بانگێشتکردن بۆ ڕەواج پێدانی بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانی وەچەخستنەوە لەسەرمرۆڤ کە محوەری سەرەکی کەونەو ئەساسی ژیانە، دوای سەرکوتنی تەجروبەی مەڕی (دوللی) کە جیهانی هەژاندو ئینتباعاتی لەدوا جێماوە کە لە نێوان پێدا هەڵگوتن و سەرسام بون پێی و ئیدانەکرنی دەخوڵتەوە.

## دەرەنجامەکان

١- مرۆڤ تەنها ئاژەڵێکی شیردەر نی یە، ڕێگە دراوە بە لەدایك بوونی ئاژەڵ بەهۆی وەچەخستنەوە(الاستنسال) بەلام مرۆڤ پێشکەوتنەکەی لە ڕێگەی فێربوون و زانست و ڕۆشەنبیری یەوە دەبێت نەوك بە وەچەخستنەوە(الاستنسال).

٢- لە حاڵەتی وەچەخستنەوە(الاستنسال) ئەو باوکەی کۆپیکراوەکەی لێکراوە باوکی سروشتی کۆپیکراوەکە دەبێت یان برای دەبێت،وە باوکی هەردووکیان باوکی ئەصلی دەبێت،یان کۆپیکراوەکە باوکی نی یە .

٣- لە حاڵەتی وەچەخستنەوە(الاستنسال) لە خانەی ژنێك کێ باوکە کچە کۆپیکراوەکەیە ئەو ژنەی خاوەن خانەکەیە، یان باوکی ئەم ژنە،یان کۆپیکراوەکە باوکی نی یە .

٤- زانایان جێ بەجێ کردنی تەکنەلۆجیای وەچەخستنەوە(الاستنسال) لەسەر مرۆڤ ڕەت دەکەنەوە دەڵێن ئەم کارە نامەشروع و نائەخلاقی ونایاسایی یە .

٥- وەچەخستنەوە(الاستنسال) ی ئادەمیزاد ئەنجامدانی بازرگانیەکی نائەخلاقیە وە زیندوکردنەوەی بازاڕی بازرگانیەکە کە کەل وپەلەکەی پارچەکانی ئۆتۆمبێل و دەبابەو چەکی وێرانکەرو مادە هۆشبەرەکان و غەیری ئەوانەش نی یە بەڵکو کەل وپەلەکەی دەبێتە خانە جەستەییەکان و هێلکۆکەکان و رەحم و ئەندامەکان وخوێن و پرۆتینات،وە غەیری ئەوانەش کە بەرهەم دەهێنرێن لە وەچەخستنەوە(الاستنسال) و بازرگانیەکەی .

٦- وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد دەبێتە هۆی لەناوبردنی خێزان کە ئەساسە بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی .

٧- بەدیهێنانی بونەوەرانێکی ئادەمی نامۆ، گریمان وەچەیەك هاتە ئاراوە کەس نەنەیدەزانی چی هەلگرتووە لە تەبیعەت و تایبەتمەندی و مواصفاتەوە ئەوەی دەکرێت ڕوبدات لە تەنگ و چەڵمەوە چۆنیەتی دەرونی و هەڵسوکەوت، کە مرۆڤ تەنا دەکات کە لەناو قەبر بێت نەك لەگەڵ ئەم ڕەگەز نامۆیانە کە نازانرێت ئەصل نەسەبیان کێ یەژیان بەسەر بەرێت .

٨- سودوەرگرتن لە وەچەخستنەوە(الاستنسال) بۆ مەبەستی زانستی .

٩- چارەسەرکردنی حلآتی نەزۆکی بەشێوەیەك کە وەچەخستنەوە(الاستنسال) پێویستی بە معاشەرەی جنسی نی یە،تەنها پێویستی بە خانیەکی پیاو هەیە بۆ چاندنی لە هێلکۆکەی ژنەکەی .

١٠- باشکردنی جۆری مرۆیی سود وەرگرتن لەوانەی خاوەن بەهرەو توانان پاش مردنیان .

# ڕاسپاردەکان

١- پێویستە لەسەر کۆمەڵگا وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد قەدەغە بکات ئەمەش لەڕێگەی یاساوە یان هەرنەبێت دیاریکردنی توێژینەوەکانی هەندەسەی بۆماوەیی و ئاراستەکردنیان بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی.

٢- پێویستە یاسا تەدەخول بکات لە پێناو ڕێکخستن و پلاندانان بۆ توێژینەوەکانی بایەلۆجی کە کاریگەیان هەیە لەسەر چارەنوسی کەلتوری بۆماوەیی بۆ مرۆڤایەتی بە گشتی .

٣- قەدەغەکردنی وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد بەهەردوو ڕێگەکەی کە باسکراون وەبەهەر ڕێگەیەکی تر ببێتە هۆی زۆربوونی ئادەمیزاد.

٤- قەدەغەکردنی هەموو حاڵەتەکانی وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد

٥- قەدەغەکردنی وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد لەژێر هەر بروبیانوێك بێت

٦- پێوسیتە یاسایەك دەربکرێت بۆ مافەکانی کۆرپەلە.

٧- یاسای توند سەبارەت بە قەدەغەکردنی وەچەخستنەوە لە ڕێگای کۆپیکردنی ئادەمیزاد بەشێوەیەك هەموو ئەو محاوەلاتانەی ئێستا هەن هەڵبوەشێنێتەوە،وە لە داهاتووشدا هەڵیبوەشێنێتەوە هەرچەندە تەقەنیاتیش پێش بکەوێت .

٨- قەدەغەکردنی هاوپەیمانێتی عیلم لەگەڵ سەرمایە کە تەنها لە بەرژەوەندی سەرمایەدا بێت، وە شتێك نەهێنێتە ئاراوە لە خراپە بەولاوە، بە تەواوی باوەڕمان وایە کە هەموو شانەیەك لە لەش کۆمەڵێك خانەی

(جینی ) ئیحتیات لەخۆی دەگرێت بەردەوام فەرەبووی خانە لەناوچووەکان دەکاتەوە

٩- پێکهێنانی لیژنەی تایبەتمەند لە بواری ئەخلاقیاتی ژیان بۆ پشت پێ بەستنی پرۆتۆکۆڵەکانی توێژینەوەکان لە دەوڵەتان .

# المصادر - سەرچاوەکان

١) الكتب

١ - د.احمد محمد كنعان،الموسوعةالطبية الفقهيه،الاردن،شارع فردان، دارالنفائس، لطبعةالثانية.لسنة ٢٠٠٨ م .

٢- العلامةابى الفضل جمال الدين محمدبن مكرم،لسان العرب،لبنان بيروت الطبعة الاولى،مطبعة.لسنة ٢٠٠٠ م .

٣- لابى عبدالرحمن الخليل بن احمد الواهيدى،كتاب العين، بيروت .الطبعة الثانية.لسنة ٢٠٠٥ م .

٤- د.سعدى اسماعيل البرزنجى و سعيد شيخو السندى،المشاكل القانونية الناجمة عن تكنولوجيا الانجاب الجديدة. اربيل . جامعة صلاح الدين . لسنة ٢٠٠٢ .

٥- د.خالد فائق العوبيدى،الوراثة والاستنساخ،لبنان. بيروت .دار الكتب العلمية، طبعة الاولى.لسنة ٢٠٠٥ م.

٦- د.عبدالستار الحاج اسميرالرجبو،الهندسة الوراثية والاستنساخ البشرى فى القران الكريم، موصل،مطبعة اوفيست الانتصار، الطبعة الاولى .لسنة ٢٠٠٠ م .

٧ - د.على محى الدين القره داغى و د.على يوسف المحمدى،القضايا الطبية المعاصرة، لبنان بيروت ،الدار البشائر الاسلامية. الطبعة الثالثة.لسنة ٢٠٠٨ م

٨- شيخ عرفان بن سليم العشا حسونة،جامع المهلكات من الكبائر والحرمات، لبنان، بيروت ا،دار الكتب العلمية، لطبعة الثانية .لسنة ٢٠٠٦ م .

٩ — شيخ عرفان بن سليم العشا حسونة،الاستنساخ جريمة العصر، بيروت،مكتبة العصرية، الطبعة الاولى، لسنة ٢٠٠٦ م .

١٠- د.ماجد طيفور،روعة الخلق، لبنان بيروت،لطبعة الاولى،الدار العربية للعلوم. لسنة ١٩٩١ م

١١- د.محمد سليمان للاشقر،ابحاث اجتهادية فى الفقه الطبى، الاردن دار النفائس، الطبعة الاولى، لسنة ٢٠٠٦م .

١٢- د.محمد صالح المحب، حول الهندسة الوراثية، لبنان .بيروت،الدار العربية للعلوم، طبعة الأولي، لسنة ٢٠٠٠ .

١٣- د. محمود الحاج قاسم محمد . الأستنسال بين العلم والدين . موصل .طبعة الأولي . لسنة ١٩٩٩

١٤ - د.نورالدين مختارالخادمى،الاستنساخ بدعة العصر،لبنان بيروت،داروحى القلم .لطبعة الاولى.لسنة ٢٠٠٤ م .

١٥- د.هانى خليل رزق،موجز تاريخ الكون، سوريا،دار الفكر،ديمشق-طبعة الاولى.لسنة ٢٠٠٥ م .

٢) الموقع الالكترونية .

١- مقال منشور عن الأنترنيت www.ewtn.com